# پەیامی فیقهی

## فیقهی ئیسلامی و
## هەڵوێستەیەکەی پێویست

د. عومەر عەلی

پەیامی قیبلە
ڕۆشنبیریی گشتی و ئیسلامی . زانست و ئیمان


ناوی کتێب: پەیامی فیقهی
نوسەر: عومەر عەلی
دیزاینی ناوەوەو بەرگ: توانا ئەحمەد
چاپخانە:
تیراژ:
نرخ:

ژمارە (      )ی ساڵی (      )ی
لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی:

کاتێك باس لە فیقهی ئیسلامی دەکرێت زۆریك بەبێ بیرکرنەوە ڕاستەوخۆ بیری بۆلای یەکێك لە ئیمامەکان دەڕوان بۆ نمونە ئیمامی شافعی وە زۆرێکیش بۆلای چوار مەزهەبەکە ئەوەی کە زۆر مەشهورن و ئێستە لەسەرانسەری دونیادا پەیڕەوی مەزهەبەکانیان دەکریت ئەویش هەر چوار ئیمامی بەڕێز شافعی، حەنەفی، ئەحمەد، مالیك. بەڵام لە ڕاستیدا فیقهی ئیسلامی خۆی بۆخۆی زۆر لەوە فراوانترە کە بەوشێوە بچوك بکرێنەوە. وە ئەگەر سەیرێکی مێژوو بکەین دەبینین کەسانێکی زۆرو وەشارەزا هەبووە لەو سەردەمی سەرهەڵدانی مەزهەبانەدا کە دەتوانم بڵێم زۆریان لەم ئیمامانە زیرەکتریش بوون بەڵام بەهۆی ڕێگە گرتن لە ئیجتیهادو وەهەروەها نەبوونی قوتابی زۆرێك لەو مەزهەبانە فەوتاون مەگەر وەك ئاماژەیەك لە هەندێك کتێبدا بیان بینین. وە دەبێت ئەوەمان لە پێش چاو بێت کە هەریەك لەو ئیمامە بەڕێزانە خێری خۆیان دەستکەوتووە لە ئیجتیهادەکەیان ئەگەر پێکایان بێت یان نە، ئەگەر پێکایان بێت دوو پاداشتیان بۆ هەیە وەگەر نەیان پێکابێت یەك پاداشتیان بۆ هەیە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەگەر نەیان پێکابێت ئێمە شوێنیان بکەوین ئایا ئێمەش پاداشتێکمان بۆ هەیە ئەمە جێگەی ووردبوونەوەیەو دەبێت بەردەوام بگەڕێین بەدوای باشترین بۆچوندا وە یان شیکاریدا. ئەویش ئێستە

تـا ڕادەیـەك ئاسـانە هەمـوو کتێبـەکان لەبەردەسـتدا هـەن دەتوانرێـت بـەراورد بکرێـت وە دواتـر ئەوانـە وەربگیرێـت کـە ڕای زۆرینـە لەسـەرین (الاجـماع) جێگـەی نیگەرانیـە ناکرێـت کـە مرۆڤـەکان تەنهـا دوای مەزهەبێـك بکـەون و وە تەنهـا ئـەو بەڕاسـت بزانـن و دەمارگیریـان بـۆ دروسـت ببێـت بەرانبـەری! وەك بەداخـەوە کـە بـووەو وە هەتـا تـا ئێسـتەش هـەر کـەم تـا زۆر هـەن ئـەو کەسانەی کـە ئـەو بیرۆکـە پەسـەند دەکـەن و گـوێ بـۆ بەرانبـەر ناگـرن و بـەراوردی مەسـەلەکان ناکـەن! وە هەروەهـا زۆرکەسـیش هـەن بـە پێچەوانـەوە کـە هیـچ حسـابێك بـۆ مەزهەبـەکان ناکـەن و وا دەزانـن ئەمـە تەنهـا شـتێکە پەیوەنـدی بـە کات و زەمانـەوە هەیـەو مەزهەبـەکان کاتیـان بەسـەرچووەو تـەواو... لەکاتێکـدا ئەگـەر بیـان دوێنـی هیـچ زانیاریـان نـی یـە لەسـەر ئیسـلام وەیـان هەیانـە زۆرکـەم و تەنهـا کۆمەڵـە زانیاریەکـی سـەرەتاییە. بـەڵام کاتیـك کـە دیراسـەی فیقهـی ئیسـلامی دەکەیـن دەبینیـن ئاسـانکاریەکی زۆر زۆری تێدایـە بۆمـان وەك وابێـت هەمـوو کارەکانیـان کردبێتـە تیکەیەکـی چـەورو حـازر بۆمـان بەبـێ ئەزیەتێکـی زۆر مەبەسـتەکان دەسـت دەکـەون. خـۆ ئەگـەر ئاسـتی تێگەشـتنی خۆمـان بـەرز بـووەوە بـەو ئاسـتەی کـە بتوانیـن خۆمـان بۆخۆمـان ڕاڤـەی ئایـەت و فەرمـوودەکان بکەیـن ئـەو کاتـە مەزهـەب مانایەکـی وای نامێنـێ بـەڵام هەریـەك لـە ئێمـە دەبێـت ئـەو پرسیارە بکەیـن لەخۆمـان ئایـا ئێمـە لـەو ئاسـتەداین؟ فیقهـی ئیسـلامی ئاشـکرایە هەنـدێ شـتی پەیوەسـتە بەکاتـەوە دەکریـت زوو زوو ئەمانـە تـازە بکرێنـەوە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر جیـاوازی هەیـە... بـەڵام ئـەو مەسـەلانەی کـە ڕا جیـاوازی تێدایـە هەمـووی پەیوەسـت نیـن بەکاتـەوە بەڵکـو بەشـێکی زۆر زۆر کەمـی فیقهـی ئیسـلامی پەیوەسـتە بەکاتـەوە وە ئـەو ڕاجیاوازیـەی کـە هەیـە لـە نێـوان مەزهەبەکانـدا زۆرن بـەڵام زۆربـەی زۆری دەگەڕێتـەوە بـۆ تێگەشـتنی ئـەوان لـە دەقـە شـەرعیەکان وە لێکدانەوەیـان بـە چەندەهـا ڕێگـە، هەڵـەی زۆرێـك

خەڵکـی ئەوەیـە زۆربـەی ڕاجیاوازیـەکان دەگێڕنـەوە بـۆ زەمـەن و کات وە هەیـە نمونـەی ئەمەشـی بـە دەسـتنوێژ لێکداوەتـەوە لەکاتێکـدا کـە دیراسـەری فیقهـی ئیسـلامی دەکـەی بەرانبـەر دەسـتنوێژ بـۆ نمـون لـە مەزهەبـی شـافعیدا لەگـەڵ حەنەفیـدا ڕا جیاوازیـەکان زۆر دووره لـە کات و زەمانـەوە بەڵکـو ڕاجیاوازیەکـە هیـچ پەیوەسـت نـی یـە بـەکات و زەمانـەوە هـەردوولا ڕای خـۆی داوە بەبـی وەسـتانی بـە کاتـەوە ئـەوە تەنهـا نمونەیەکـی بچـوك بـوو. وە دەبێـت خەڵکیـش لـەوە ئـاگادار بکرێنـەوە کـە تەنهـا پەیڕەوکردنـی مەزهەبێـك و وەلا نانـی ئەوانـی تـر نەگونجـاوە تەسـك کردنـەوەی ئـەو بەرفراوانیەیـە کەهەیـە، بـەڵام ئەمـەش مانـای ئـەوە نـی یـە ئیـتر بـە ئـارەزووی خۆمـان لـە هەرلایـەك هەرچیـمان پـێ خـۆش بـوو هەڵیـان بژێریـن بەڵکـو ئـەوەی کـە گرنگـە دەبێـت حسـاب بکـەن بـۆ هەمـوو مەزهەبـەکان و ڕای زۆرینەیـان وەرگریـن هـەروەك دەبیـت زانایانـی سەردەمیشـمان لەبیـر بێـت.

# المذهب الظاهري

پێمان باشە بە کۆمەڵە پرسیارێك دەست پێ بکەین و بڵێین:- مەزهەب لەسەردەمی پێغەمبەردا درودی خوای لێ بێت بۆ نەبووە؟ دواتر بۆ دروست بووە؟ بونی مەزهەب بۆ؟ گرنگی مەزهەب چی یە؟گرنگی لەژیانی ئێمەدا چی یە؟ تاچەند ئێمە دەبێت پابەند بین پێیەوە؟ ئایا گوناهبار دەبین بەوازهێنان لێی؟ وەرگرتنی مەزهەبێك لە شتێکداو ڕەد کردنەوەی مەزهەبێکی تر تاچەند کارێکی شیاوە؟ بۆ دەمارگیری لەسەر مەزهەب؟ وە بۆ ڕەد کردنەوەی مەزهەب. ئومێد دەکەین وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دەروازەیەك بێت بۆ بیر قوڵ کردنەوەمان لەسەر مەزهەب.

لەسەر دەمی پێغەمبەردا درودی خوای لێ بێت پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت خۆی پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورەدا هەبووە لە ڕێگەی نیگاوە، کاتێك هەر کێشەیەك کە دروست دەبوو لەبەر بوونی ئەو پەیوەندیە لەگەڵ خوای گەورەدا لە ڕێگەی نیگاوە چارەسەر دەکراو شتەکان بە تەواوی دەبڕایەوە بەبێ دوودڵی و ڕاجیاوازی، لەم کاتەدا بوونی مەزهەب مانای نییە.

هۆی دروستبوونی مەزهەب دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی مسوڵمانان پێی، بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەو پرسیارانەی کە ڕۆژانە بۆیان دروست دەبێت لەسەر کارە کرداریەکان هەر لە چۆنێتی پاکوخاوێنیەوە تا نوێژ و ...تاد، بە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت لە ناو مسوڵماناندا وەك جەستە نەماوە، وە مسوڵمانانیش پێویستیان بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان دەبێت و دەبێت بنەمایەك هەبێت کە بتوانن کاری لەسەر بکەن، جا بنەماکە خۆی بۆ خۆی ئاشکرایە کە قورئان و سوننەتە بەڵام تێگەشتن لێی پێویستی بە کەسانی پسپۆڕ هەیەو وە مسوڵمانانیش بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی بارودۆخی

ژیانیانـەوە نەگونجـاوە هەمـووی بتوانێـت تێگەشـتنێکی قوڵـی بـۆ هەبێـت و وە خۆیـان بـۆ خۆیـان ناتوانـن وەڵامـی پرسـیارەکانی خۆیـان بدەنـەوە، هەمـوو ئەمانـە وای کـردووە کـە مەزهـەب دروسـت ببێـت.

بونـی مەزهـەب دەگەڕێتـەوە بـۆ غیابـی پێغەمبـەر[1] و پێویسـتیەکی حەتمـی مسـوڵمانان بەشـێوەیەکی گشـتی[2].

گرنگـی مەزهـەب ئەوەیـە هەمـوو ئـەو شـتانە ڕوون دەکاتـەوە کـە زۆر لـە مسـوڵمانان ناتوانـن[3] خۆیـان پێـی بگەن.

وە بوونی مەزهەبیش هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە.

گرنگـی مەزهـەب لەوەدایـە کارەکان ئاسـان دەکات و ئـەو دەقانـەی چەنـد مانایـەك هەڵدەگـرێ ڕوونـی دەکاتـەوە.

ئێمـە بەهـۆی نەتوانینـی خۆمـان دەبێـت بگەڕێینـەوە سـەریان وە هـەرکات خۆمـان توانیـمان وەڵامـی پرسـیارەکانمان ڕاسـتەوخۆ لـە قورئـان و فەرمـوودە ڕاسـتەکان دەربهێنـن پێویسـتمان بـە مەزهـەب نابێـت و هیـچ شـتێك ناتوانـێ ناچـاری ئەوەمـان بـکات کـە دوای مەزهـەب بکەویـن لـە ڕووی شـەرعەوە ئەڵبـەت چونکـە لـە هەندێـك لـە سـەردەمەکاندا خەڵکـی بـەزۆر مەزهەبـی بەسـەردا سـەپێنراوە، ئێسـتەش لـە هەندێـك وڵات هەندێـك لـە مەزهەبـەکان تێکـەڵ بـە یاسـای وڵات کـراوەو خەڵکـی ناچـار بـە قبـوڵ کردنـی دەکریـت.

١ مانای ئەوە نی یە مەزاهیبەکان لە جێگەی پێغەمبەردا کار بکەن

٢ لەبـەر ئـەوەی دەوترێـت گشـتی چونکـە مـەرج نـی یـە هەمـوو کـەس پێویسـتی بـە مەزهـەب بێـت کەسـێك خـۆی بگاتـە ئـەو ئاسـتەی کـە بتوانێـت لـە دەقـە شـەرعیەکان و بنەماکانـی ئیسـلام تـێ بـگات و خـۆی بـۆ خـۆی پێویسـتیەکانی ڕاسـتەوخۆ بەبـێ یارمەتـی مەزهـەب دەسـت دەکەوێـت، لێرەشـدا ئـەوە ڕوون دەبێتـەوە کـە هـۆی مەزهـەب نـا توانایـی خەڵکـی یـە لـە تێگەشـتنیان لـە بنەمـا شـەرعیەکان، وە هـەر ئـەوەش وای لـەو مەزهەبانـە کـردووە هەسـتن بـەو کارانـە تـا وەك ئەرکێکـی دینـی پێداویسـتیەکانی مسـوڵمانان جـێ بەجـێ بکـەن.

٣ نەتوانیـن نـەك بـەو مانـا شـتێکی حەتمـی بێـت بەڵکـو سروشـتی مرۆڤـەکان وایـە بەهـۆی بارودۆخـی جـواراو جـۆرەوە ئـەو هەلانـەی لەدەسـت دەچێـت

هیـچ کات گوناهبـار نابیـن بـە واز هێنـان لەمەزهـەب مـادام بەڵگەمـان بەدەسـتەوە بـوو وە ئـەو بەڵگەشـی کـە بەهێـزە بۆچوونـی هـەر مەزهەبێکـی لەگەڵـدا بێـت ئـەوە لـە پێشـترە وەری بگریـن نـەك مەزهەبێکـی دیـاری کـراو.

هەمـوو شـتەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ بەهێـزی بەڵگەکـە، کەوابـوو بەڵگـە بەمـەرج دەگیـرێ و پابەنـد نەبوونمـان بـە بەڵگـەوە تاوانبـار یـان بـە پێچەوانەکەیـمان دەکات نـەك مەزهـەب.

دەمارگیـری لەسـەر مەزهـەب دەگەڕێتـەوە بـۆ نـا شـارەزای لـە دیـن و سەرسـام بـوون بـە خاوەنـی مەزهـەب و فەزڵدانـی بەسـەر بەڵگـەدا.

ڕەد کردنـەوەی مەزهەبیـش بەرتەسـك کردنـەوەی ئـەو فراوانیەیـە کـە ئـەو ئیمامـە بەڕێزانـە هێناویەتیانـە کایـەوەو دەرفەتیـان بـۆ ئێمـە ڕەخسـاندووە تـا بتوانیـن هەموویـان بـەراورد بکەیـن و زیاتـر تێگەشـتنمان بـۆ دەقـەکان هەبێـت و وە دەکرێـت ئێمـەش بۆچونمـان هەبێـت لەسـەر شـتانێك کـە ئـەوان قسـەو لێکۆڵینەوەیـان لەسـەر کـردووە. وە زۆر گرنگـە ووتـەی ئـەو ئیمامـە بەڕێزانـە لیـرەدا دەستنیشـان بکەیـن تـا ببێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە باسـمان کـردوو وە بینینـی ئـەو ووتانـەی خۆیـان لەسـەر ووتوویانـە.

١- قـال الإمـام أبـو حنيفـة رحمـه اللـه : إذا صـح الحديث فهـو مذهبي وقـال : إذا قلت قـولا يخالـف كتـاب اللـه تعـالى وخـبر الرسـول صـلى اللـه عليـه وسـلم فاتركـوا قولي .

٢-وقـال الإمـام مالـك رحمـه اللـه : ليـس أحـد بعـد النبـي صـلى اللـه عليـه وسـلم إلا ويؤخـذ مـن قولـه ويـترك إلا النبـي صـلى اللـه عليـه وسـلم وقـال : إنمـا أنـا بـشر أخطـئ وأصيـب ، فانظـروا في رأيـي ، فـكل مـا وافـق الكتـاب والسـنة فخـذوه ، وكل مـا لم يوافـق الكتـاب والسـنة فاتركـوه.

٣ -وقـال الإمـام الشـافعي رحمـه اللـه: كل مـا قلـت فـكان عـن النبـي صـلى اللـه عليـه وسـلم خـلاف قـولي مـما يصـح ، فحديـث النبـي أولى ، فـلا

تقلدوني وقال: أجمع المسلمون على أن من استبان له سنة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم ، لم يحل له أن يدعها لقول أحد.
٤ -وقال الإمام أحمد رحمه الله: لا تقلدني ولا تقلد مالكا ولا الشافعي ولا الأوزاعي ، وخذ من حيث أخذوا وقال: الاتباع أن يتبع الرجل ما جاء عن النبي صلى الله عليه وسلم وعن أصحابه ، ثم هو من بعد التابعين مخير[4].

دەبینین هەموویان داکۆکی لە پێداگری لەسەر قورئان و سوننەت دەکەن و هانمان دەدەن بۆ گەڕانەوە بۆی بەدوور لە دروست بوونی دەمارگیریمان بۆیان و گرنگی دانیان بەسەر بەڵگەی ڕاستدا چونکە دەکرێت ئەوانیش نەیان پێکا بێت.

کاتێك باس لە مەزهەب دەکرێت و دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای دروست بوونیان و لێکۆڵینەوە لە هۆکاری دروست بوونیان دەکەین دەبینین کۆمەڵانێك دیراسەیەکی زۆر ووردی قورئان و سوننەتیان کردووە وە دواتر هەستاون بە ڕاڤەکردنی ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووەو وە ئەوەش کە لێی بێدەنگ بووە وە دابەش کردنیان بە چەند تەوەرەیەکەوە بە کورتی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ووردەکاریە بەشێوەیەکی ئاسان بۆ خەڵکی گشتی، زۆرێك لەو مەزهەبانە لە پاکو خاوێنیەوە دەست پێ دەکات و بە لەسەر بەندایەتی کۆتای پێ دێت، وە کاتێك دەڵێین ڕاڤەکردنی قورئان و سوننەت نەك بەو مانا کە ووردەکاریەکانی هەموو ئایەت و فەرموودەکانیان باس کردبێت و شیان کردبێتەوە چونکە ئەوە ئیشی موفەسیرو مانا لێکدەرەوەکانن بەڵکو دوای تێگەشتنیان و تێڕوانیان لە دەقەکان بۆ خۆیان و دواتر داڕێژانیان بەسەر کۆمەڵە بەشێکدا وەك باسی پاك و خاوێنی، نوێژ،ڕۆژوو،زەکات،حەج،کڕین و فرۆشتن،ژن و ژنخوازی و تەڵاقدان،جیهاد کردن...تاد، وە داڕێژانی مەزهەبەکان لەسەر ئەو بنەمایانە

4 http://www.ftawa.ws/fw/showthread.php?p=45065

دامـەزراوە کـە لـە قورئـان و سـوننەتەوە سـەرچاوە دەگرێـت مەزهـەب بـاس لـە کارە کرداریـەکان دەکات.

گەرچـی مەزهەبـەکان لـە مێـژووی ئیسـلامیدا زۆرن بـەڵام کەمـی ماوەتـەوەو کەوتۆتـە بەردەسـتی ئێمـە تـا بتوانیـن دیراسـەتیان بکەین،لـە مێـژووی ئیسـلامیدا هـەردەم کەسـانێك بـوون لـە خەمـی ئومـەدا بـن و ژیانـی خۆیـان بـۆ سـودی کۆمـەڵ دابیـن بکـەن، مانـەوەی کەمـی ئـەو مەزهەبانـە وانـەی زۆری تێدایـە کـە بـە دیراسـەکردنیان بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە، لەناوچوونـی هەندێـك مەزهەبیـش هـەر وانـەی زۆری تێدایـە بەتایبـەت بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە دەمارگیـری مەزهەبیـان هەیـە ئایـا ئەگـەر ئـەو مەزهەبانـە ئێسـتە بمایـەن چیتـان دەوت لەگەڵیانـدا، هـەروەك وانەیەکـی گرنگیشـی تێدایـە بـۆ گشـت مسـوڵمانان بۆچـی ئـەو مەزهەبانـە لەنـاو چـوون کـە ئەویـش دەگەڕێتـەوە بـۆ نەبوونـی قوتابـی پێویسـت و بەدەمـەوە نەچوونـی لەکاتـی خۆیـدا کـە گـەر بێـت و بایەخیـان پـێ بدرایـە ئێسـتە پێـی سـودمەند دەبوویـن.

بەگرنگمان زانـی بیـری خوێنـەران بڵاو بکەیـن لەسـەر مەزهـەب و کۆمەڵـە شـتانێك بوروژێنیـن تـا لـە دوایـدا بەهـۆی گـەڕان بـەدوای وەڵامەکانیانـدا بەهرەمەنـدو سـودمەند بیـن[٥].

لێـرەدا دێینەسـەر مەزهەبـی ظاهیـری و ئوصولـی مەزهەبـی ظاهیـری لـە هێنانـە کایـەوەی ئـەو مەزهەبـە کـە لەژێـر دەسـتی هـەردوو زانـای بەناوبانـگ داودی زاهیـری و ئیـبن حەزمـی ئەندەلوسـی بـوو، بـە کورتـی ئـەم دوو فەقیهـە دەناسـێنێن.

٥ الموسوعة الميسرة في الاديان والمذاهب والاحزاب المعصاصرة: ج١ ل١٣٩-١٥١

## داودی زاهیری

باوكـی سـولێمان داود كـوڕی عەلـی كـوڕی خەلفـی ئەسـفەهانی چـاوی بـە دونیـا هەڵهێنـا لـە سـاڵی ٢٠٢هیجـری لـە كوفـە وە كۆچـی دوای كـرد لـە ٢٧٠هیجـری لـە بەغـداد واتـە ٦٨سـاڵ ژیـاوە، لەسـەرەتای ژیانیـدا خـۆی شـافعی مەزهـەب بـوو، لـەلای هەندێـك لـە شـافعیەكان وانـەی خوێنـدووە، گوێـی بـۆ زۆر فەرمـوودە گرتـووە تـا دواتـر ڕووی كـردە ئـەوەی كـە ئێسـتە نـاوی لێـنراوە ظاهیـری وە قیاسـی ڕەد دەكـردەوە، ئـەم زانـا بەڕێـزە بـە كـۆرەوی زانایـان بـە یەكـەم كەسێك دەزانرێـت كـە ووشـەی ظاهیـری ناسـاندبێت و لـە نێـو ئەهلـی سـونەدا، ئـەو ووشـەش هـەر لەماناكـەی خۆیـەوە مانـا دەگریـت واتـە ڕوانیـن لەسـەر ڕووكەشـی بڕیـارەكان هـەر بۆیـە دەوترێـت قیـاس ڕەد دەكاتـەوە چونكـە كاتێـك تەنهـا ڕووكەشـی ئایەتـەكان وەرگیـران ئەوسـا دەرفەتـی لـێ فامینـەوەی تـری لـێ ناكرێـت، بـەڵام دەبێـت ئەوەشـمان لەبیـر بێـت كاتێـك دەوترێـت مەزهەبـی زاهیریـەكان قیـاس ڕەد دەكەنـەوە بـەو مانـا نـی یـە كـە ئەمـان یەكـەم كەسێك بـوون كـە قیاسـیان ڕەد كردبێتـەوە چونكـە ئـەوە دیـارە یەكـەم كـەس نیزامـی موعتەزیلـی بـوو، بـەڵام ئێمـە لێـرەدا باسـی سـوننە دەكەیـن، موعتەزیلیـەكان بـە سـوننی ناژمێردریـن.

## ئیبن حەزمی ئەندەلوسی زاهیری

ئیبن حەزمی ئەندەلوسی کە کونیەکەی باوکی محەمەد عەلی یە بەناوبانگە بە ئیبن حەزم لە دایك بووە لە قرطبە لە ساڵی ٣٨٤ی هیجری وە کۆچی دوای کردووە لە ساڵی ٤٥٦ی هیجری واتە بە ١١٤ساڵ دوای کۆچی داودی زاهیری، ئیبن حەزم و زانیاری لەسەر عیلمەکان بەناوبانگە کە کەم مەسەلە هەیە خۆی لێ نەدابێت لەبەر زیرەکی و لێهاتووی و توانایەوە، قورئانی لەبەر کردووە، فەرموودەکان، زانیاری لەسەر زمان، فەلسەفە دەتوانرێت بوترێت کە ئەمە بیروباوەڕەکەی و ئوسوڵەکەی گۆڕی، دوای ئەوەی بەرەو فیقە ڕۆی لەسەرەتاوە لەسەر مەزهەبی ئیمام مالیك بوو کە ئەوکاتە مەزهەبی ئیمام مالیك مەزهەبی ئەندەلوسیەکان بوو، دواتر سەرسامی مەزهەبی شافعی بوو بەشێوەیەکی وا ئیعتبارێکی زۆر گرنگی بۆ دادەنا بەڵام ئەمەش درێژەی زۆر نەبوو دواتر کەوتە خوێندنەوەی کتێبەکانی داودی زاهیری و وازی لە مەزهەبی شافعی هێنا، پێش ساڵی ٤١٨ی هیجری کە بینی دەلیلەکانی شافعی ئیستیحسان ڕەد دەکاتەوەو دەگونجێ لەگەڵ ڕەد کردنەوەی قیاسیشدا وە هەموو بوونی زاهیریەکان، ڕووی کردەی وەرگرتنی زاهیری وە زۆر توند بوو تێیدا هەتا زیاتر توند بوو لە داود ئەسفەهانی کە ئەو بە کەسی یەکەم دادەنرێت.

ئیبن حەزم کارێکی زۆری کرد لە سیاسەتداو هەوڵێکی زۆری دا لە گەڕانەوەی دەوڵەتە بەهێزەکەی ئەندەلوسدا، هەروەها جەنگاوەرێکی قارەمان بووە لە دژی نەسرانیەکان و بە شمشێرو بە قەڵەمەکەشی بەرگریەکی گەورەی لە ئیسلام کردووە.[٦]

پێناسەی مەزهەبی زاهیری: ئەم مەزهەبە لەسەر ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان کار دەکات و تەنها ڕووکەشەکانیان لەپیش چاو دەگرێت بۆ

6 http://www.ibnamin.com/Thahiri.htm

سەرچاوە فیقهیەکان. ڕێگە بۆ ژێری ناهێڵنەوەو وە لەم مەزهەبەدا قیاس نییە[7] ئەوەی کە پشتی پێ دەبەستن و کاری لەسەر دەکەن تەنها قورئان، فەرموودەکان، کۆڕەوی هاوەڵەکان (الصحابە)، وە ئیتر هەموو ئەو شتانەی تر کە هەن و زاناو فەقیهەکانی تر وەریان گرتووە کاریان لەسەر کردووە مەزهەبی زاهیری بە گومانـاوی نـاوی دەبـات و سەیری دەکات وەك (قیاس[8]، استحسان، مصالح المرسلە، سد الذرائع، وە شەرعی پێش ئیسلام)[9]

هۆکاری ئەم مەزهەبە دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی دانی زیاتر بە قورئان و فەرموودەکان کە ئەسڵن و سەرچاوەی کارەکانن، هەربۆیە کتێبەکانیان پڕن لە بەڵگەی قورئان و سوننەت، جێگەی بەبیر هێنانەوەیە بەلای هەندێکەوە ناوی مەزهەبی فیکریشیان لەم مەزهەبە هێناوە.

خۆ ئەگەر ئێمە بێت و تەنها سەیری قورئان و فەرموودەکان بکەین لەگەڵ کۆڕەوی هاوەڵاندا لەوانەیە وەڵامی زۆر شتمان دەست نەکەویت هەربۆیە مەزهەبی زاهیری چیان کردووە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە کارکردن بە الاستصحاب کە ئەویش ئیباح کردنی شتەکانە لەسەر بنەمای سەرەکی وەك خوای گەورە دەفەرموی {هو الذي خلق لكم ما في الارض جميعا}[10].

7 قیاس وەك پێوەریك دادەنرێت کە بەهۆی ئایەتێکەوە حوکمێکی تر وەردەگیرێ بە بەرچاو گرتن لە مەقسودی ئایەتەکە بۆ نمونە کە خوای گەورە مەشروبی سەرخۆشکەری لەبەرچی حەرام کردووە عیلەتی حەرام کردنەکە سەرخۆش بوونە کە ژێری لە دەست دەچێت جا لەسەر ئەو بنەمایە هەر شتێکی تر کە بێتە کایەوەو بەکار بێت بۆ خواردن و سەرخۆشکەر بێت لەسەر ئەوە بنەمایە حەرام دەبێت با قورئانیش باسی ئەو شتەی بەزات نەکردبێت مادام عیلەتەکە ئاشکرایە حوکمەکەش ئاشکرایە. هەربۆیە پێمان باش نەبوو لە بری ووشەی قیاسدا مانا کوردیەکەی دا بنیین لەبەر ئەوەی حوکمی شەرعی پیوە بەندە بەگۆڕینی ناوەکەی دوورنی یە بە قیاس لێی تێ نەگەین.

8 قیاس واتە هاو شێوە بوون جا دەکرێت مادی بێت وەك ئەم شتە بەرانبەر بەو شتە وەیان مەعنەوی بێت وەك خۆشویستی دووکەس بەقەدەر یەك.

9 http://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%85%D8%AF%D8%B1%D8%B3%D8%A9_%D8%B8%D8%A7%D9%87%D8%B1%D9%8A%D8%A9

10 البقرة ٢٩

# بنەما سەرەکیەکانی مەزهەبی زاهیری

١-قورئـان، کـە یەکـەم سـەرچاوەی شـەریعەی ئیسـلامییە وە پارێـزراوە لای خـوای گـەورەو تـا ڕۆژی دوای دەمێنێتـەوە، وە کارەکانیـش لـە قورئانـدا یـان ئەوەیـە کـە خـۆی بـۆ خـۆی ڕوونـە وەك ژن و ژنخـوازی و تەڵاقـدان و مـاڵ بـەش کـردن وەیـان پێویسـتی بـە سـوننەت هەیـە بـۆ زیاتـر ڕوون کردنـەوە وەك ئەحکامـی نوێـژ و ڕۆژو حـەج و ئـەو جـۆرە شـتانە وە قورئـان خـۆی ئامـاژەی تێدایـە بـۆ ئـەوەش وەک دەفەرمـوێ: «وأنزلنـا إليـك الذكـر لتبـين للنـاس مـا نـزل إليهـم»[١١]. ئەحکامەکانـی قورئـان یـان خـۆی ڕوونـەو پیویسـتی بـە ڕوونکردنـەوە نـی یـە وەیـان هەندێکـی ڕوون نـی یـەو پیویسـتی بـە ڕوونکرنـەوە هەیـە جـا ئەوکاتـە ڕاجیـاوازی دروسـت دەبێـت لەسـەری هەیـە بەشـێوەیەك تێدەگەیـەت هەیـە ئـەو زانیاریـە نـی یـە درەنـگ تـر تێـدەگات، ئیـبن حـەزم ئەمـە ڕەد دەکاتـەوەو بـەوە دەیبڕێتـەوەو دەڵـی قورئـان نیگایەکـە لای خـوای گـەورەوە هاتـووەو ڕاجیـاوازی تێـدا نـی یـە وە کاتێـك تەفسـیراتی بـە چەنـد شـێوەیەك دەکرێـت وەکـو وابێـت دژایەتـی مانـا لـە قورئانـدا هەبێـت وە خـوای گـەورە خـۆی ئـەوەی بڕیوەتـەوە وەك دەفەرمـی: «أفـلا يتدبـرون القـرآن ولـو كان مـن عنـد غـير اللـه لوجـدوا فيـه اختلافًـا كبـيرًا»[١٢]. ئەگـەر یەکێـك گومانـی دژایەتـی بینـی لـە قورئانـدا لـەم حاڵەتانـە بـەدەر نـی یـە یـان دەکرێـت تەوقیـف لـە نیوانیانـدا بکریـت، یـان تەخصیـص بکرێـت وەیـان نەسـخ.

٢-سـوننەت: زاهیریـەکان سـوننەت دەکـەن بـە دوو بەشـەوە، یەکـەم سـوننەتی متەواتـر[١٣] ئـەم بەشـە وەردەگـرن بەبـێ ڕەد کردنـەوەی، وە بەلاشـیانەوە وایـە

---

١١ النحل ٤٤

١٢ النساء ٨٢

١٣ بـەو فەرمـوودە دەوترێـت کـە لـە کۆمەڵێکـەوە وەرگیـرا بێـت و نەگونجـاو بێـت کـە ئـەو کۆمەڵـە لەسـەر خراپـە کـۆ ببنـەوە.

ئەگـەر دووکەسـیش بێـت ئـەو فەرمـوودەی گەڕاندبێتـەوە بـەڵام بەمەرجێـك کەسـەکان نەگونجـاو بێـت لەسـەر درۆ کـردن.

بەشـی دووهـەم سـوننەتی خەبـەری ئاحـادە[14]، لـەلای زاهیریـەکان دەبێـت کاری پـێ بکرێـت و بـە واجبـی دەزانـن، جیـاوازی لەگـەڵ متەواتـردا ئەوەیـە کـە متەواتـر پێـش دەخـەن، بەمەرجـی دەگـرن کـە ئەوکەسـانەی دەیگێڕنـەوە دەبێـت جێـی متمانـە بـن ، بەرزتریـن پلـەی متمانـەش لایـان دەبێـت ئـەو کەسـەی کـە فەرمووده‌کـە دەگێڕێتـەوە دەبێـت تێگەشـتوو بێـت و بیـری زۆر چـاك بێـت لـە لەبەرکردنـدا.

٣-کـۆڕەوی زانایـان (الاجـماع) مەبەسـت لـە کـۆڕەوی زانایـان لـەلای زاهیریـەکان تەنهـا سـەحابەیە بەلایانـەوە چونکـە دەکرێـت و شـتێکی گونجـاوە کـە هاوەڵەکانـی پێغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت کـۆ بـوو بێتنـەوە لەکاتـی خۆیـداو مەسـەلەکانیان هەڵسـەنگاندبێت، زاهیریـەکان کـۆڕەوی زانایـان نەیـان کـردووە بـە سـەرچاوەیەکی بـەردەوام و کاری لەسـەر بکرێـت بەڵکـو تەنهـا کـۆڕەوی هاوەڵانیـان مەبەسـتەو بـەس. لێـرەدا جیـاوازی هەیـە لەگـەڵ مەزهەبەکانـی تـردا کـە کـۆڕەوی زانایـان لای ئـەوان بەردەوامـە. هـۆی وەرنەگرتنـی کـۆڕەوی زانایـان لای زاهیریـەکان ئەوەیـە دەڵێـن شـتێکی نەگونجـاوە کـە هەمـوو زانـاکان کۆببنـەوە لەسـەر شـتیك، بـەڵام هاوەڵەکانـی پێغەمبـەر درودی خـوای لـێ بێـت ئـەوە دەکرێـت و گونجـاو بـووە.

٤-الاسـتصحاب: مەبەسـت لەمـە مانـەوەی حوکـم لەسـەر بنەمـای دەقـەکان هەتـا دەقێکـی تـر دێـت و دەیگـۆڕێ، زاهیریـەکان بڕیاریـان لەسـەر ئەوەیـە کـە گۆڕانکاریـەکان بـە دەق دەکرێـت وە بەڵگەشـیان «أن الأصـل في الأشـياء الإباحـة»

14 خەبـەر بـەو فەرمـوودە دەوترێـت کـە مەرجەکانـی متەواتـر هەمـووی تێـدا نەبێـت و لـە خـواروی ئـەوەوە بێـت. بـۆ تێگەشـتن لـەم دەسـتەواژانە پێویسـتە بگەڕێینـەوە بـۆ زانیـاری زاراوەکانـی فەرمـوودە (علـم الحديـث).

یـە.
ئـەوەی کـە زۆر مایـەی نرخاندنـە لەلایـەن مەزهەبـی زاهیریـەوە دانەخسـتی دەرگای ئیجتیهـادە هـەر بۆیـە پیداگـرن لەسـەر ئـەو بۆچوونانـە، جێگـەی خۆشـیەتی کـە بەڕاسـت بـۆ ئـەو بۆچونـە بڕوانیـن چونکـە کاتێـك ئێمـە هـەر دوای مەزهـەب کەوتیـن ئـەوان دەکەیـن بـە بەڵگـە بەسـەر خۆمانـەوەو تەمـەڵ دەبیـن.
کاتێـك بـە ووردی لـە مەزهەبـی زاهیـری دەڕوانیـن و بـە تایبـەت هـۆکاری ئـەم هـزرە لـە سـەردەمی خۆیـدا ئـەوە دەبینیـن کـە دەمارگیـری مەزهەبـی هەبـووە وە هەروەهـا خۆشویسـتن و پابەنـدی زۆر بـۆ دەقـە شـەرعیەکان وای کـردووە لـە هـەردوو ئیمامـی بەڕێـز کـە ئـەم مەزهەبـەی لەسـەر دروسـت بکـەن و داوای گەڕانەوەیـان بـۆ دەقـە شـەرعیەکان کـردووە، دوای ئەوانیـش هەتـا ئـەم سـەردەمەی ئێسـتە بـەردەوام کەسـانێك هـەن ئەگـەر کەمیـش بـن پشـتگیری ئـەم هـزرە دەکـەن کـە خۆشـیان لـە ئاسـتێکی زۆر بـەرزدان ئـەوەی کـە مـن خـۆم بینیومـەو مامۆسـتام بـووە شـیخ عبداللـە جدیـع کـە زانایایەکـی گـەورەی عێراقـی و خەڵکـی بەسرەیـەو دانیشـتووی شـاری لیـدزە لـە بەریتانیـاو یەکێکـە لـە ئەندامـی لیژنـەی فەتـوای ئەوروپـی وە ئـەم شـێخەو هاوشـێوەکانی توانایەکـی یەکجاریـان بەسـەر دەقـە شـەرعیەکاندا دەشـکێت و لەبـەر پێویسـت نەبـوون بـە مەزهـەب وەك خۆیـان دەتوانـم بڵێـم زیاتـر بـرەو بـەو هـزرە دەدەن وەگەرنـا هـەر مەزهەبێـك لـە مەزهەبەکانـی سـوننە بگـرە دەرکیـان بـە جـۆرە شـتانیك کـردووە زاهیریـەکان ڕووبـەڕووی دەبنـەوە گەرچـی نیەتیشـیان بـاش بێـت و وە لـە خۆشەویستیشـیان بێـت بـۆ دەقـە شـەرعیەکان، هـەروەك چـۆن قورئانیـەکان لـە خۆشەویسـتیان بـۆ قورئـان ڕووبـەڕووی فەرمـوودەکان دەبنـەوە.
لـە کۆتایـدا ئێمـە دەتوانیـن بڵێـن پشـتگیری لـە زاهیریـەکان دەکەیـن لەسـەر بنەمـای ئـەو نیەتـەی کـە دەمارگیـری مەزهەبـی نەبێـت و بـەدوای دەقـی ڕاسـت و

دروستدا بگەڕێین وە هەروەها خۆشویستمان بۆ دەقەکان زیاد بکەین و لە پێشی بۆچوونەکانەوە دایان بنێین وە هەروەها سود لە مەزهەبەکانی تریش بکەین و شتگەلێك کە ئەوان دەرکیان پێ کردووە لەوانی تردا نابینرێت سودمەندیان بین، بە ووتەیەکی شێخ جدیع کۆتای پێ دەهێنم کە لەوەڵامی پرسیارێکمدا لە وانەدا پێی ووتم» نابێت ئێمە بۆ هەر شتێك کە بمانەوێت بیکەین بە دوای ڕەئی شازدا بگەڕێین بەڵکو دەبێت ڕای زۆرینە وەرگرین بە بەرچاو گرتن لە سەر دەقە شەرعیەکان وەگەرنا هیچ شتێك نی یە لە شەرعدا کە بۆچونێکی شازی لەسەر نەهاتبێت و ئەگەر ئێمە هەر دوای ئەوانە بکەوین کە شازن لە دوایدا دەبینین شتێك نەماوەتەوە پێی بووترێت دین» وە ئەمڕۆش شتەکان زیاتر ئاسانترن لەبەردەستمانداو دەتوانرێت بەراورد بکرێن وە پێویستە ئێمەش ئەو توانا بە خۆمان ببەخشین بۆ بەدوادا چوونیان.

## سەرچاوەکان


الموسوعة الميسرة في الاديان والمذاهب والاحزاب المعصاصرة: ج١ ل١٣٩-١٥١

http://www.ibnamin.com/Thahiri.htm

http://arabic.islamicweb.com/sunni/Thahiri.htm

http://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%85%D8%AF%D8%B1%D8%B3%D8%A9_%D8%B8%D8%A7%D9%87%D8%B1%D9%8A%D8%A9

http://www.ibnamin.com/Thahiri.htm

http://dz-blanche.yoo7.com/montada-f37/topic-t82.htm

http://www.saaid.net/Doat/assuhaim/fatwa/89.htm

http://www.ftawa.ws/fw/showthread.php?p=45065

http://ar.wikipedia.org/wiki/%D8%AD%D8%AF%D9%8A%D8%AB_%D9%85%D8%AA%D9%88%D8%A7%D8%AA%D8%B1

# پێڕست

کاتێك باس لە فیقهی ئیسلامی
دەکرێت زۆریك بەبێ بیرکرنەوە
ڕاستەوخۆ بیری بۆلای یەکێك
لە ئیمامەکان دەڕوان بۆ نمونە
ئیمامی شافعی وە زۆرێکیش
بۆلای چوار مەزهەبەکە ئەوەی
کە زۆر مەشهورن و ئێستە
لەسەرانسەری دونیادا پەیڕەوی
مەزهەبەکانیان دەکریت ئەویش
هەر چوار ئیمامی بەڕێز شافعی،
حەنەفی، ئەحمەد، مالیك. بەڵام
لە ڕاستیدا فیقهی ئیسلامی خۆی
بۆخۆی زۆر لەوە فراوانترە کە
بەوشێوە بچوك بکرێنەوە

# پەیامی فیقهی


د. عومەر عەلی

٢٠١٨